زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست ١٤



# سەد هۆکار بۆ سەرخستنی پێغەمبەر

ئامادەکردنی لیژنەیەکی جیهانی بۆ سەرخستنی کۆتا پێغەمبەران

صلى الله عليه وسلم




وەرگێرانی
عبدالله خالد

پێداچوونەوەی
م.صلاح الدين

چاپی سێیەم 1434هـ - 2013م

زنجیره ڕێنماییەكانی ڕێگای ڕاست

( ١٤ )

﴿١٠٠﴾

# سەد

# هۆكار بۆ

# سەرخستنی

# پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

ئامادە كردنی

لیژنەیەكی جیهانی بۆسەرخستنی كۆتا

پێغەمبەران ﴿ﷺ﴾

وەرگێڕانی :

عبدالله خالد

پێداچونەوەی :

م/ صلاح الدین عبدالكریم

ناوی کتێب: سەد هۆکار بۆ سەرخستنی پێغەمبەرﷺ.

ئامادەکردنی: لیژنەیەکی جیهانی بۆ سەرخستنی کۆتا پێغەمبەرانﷺ.

ناوی وەرگێڕ: عبدالله خالد عبدالحمید .

پێداچونەوەی: م.صلاح الدین عبدالکریم .

ژمارەی سپاردن: (٣٤٦) .

زنجیرە: زنجیرەی (١٤) لە زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست.

نۆرەو ساڵی چاپ: سێ یەم ، (١٤٣٤هـ ٢٠١٣م).

تیراژ: ١٠٠٠ دانە. چاپخانەی شارستان/سلێمانی

تایپ: هێمن کریم عزیز

دیزایینی بەرگ: ئاسۆ جەباری

**بۆ دەست کەوتنی ئەم کتێبە**

**کتێبخانەی سوننە لەبازاڕی کەنار سلێمانی ٠٧٧٠٣٦٧٥١٤١**

لو كان حبك صادقاً لأطعته
إنَّ المحبَّ لمن يحبُّ مطيع

## قال العباس بن مرداس السلمي:

وجهتُ وجهي نحو مكةَ قاصداً
أبايعُ نبيَ الاكرمينَ المباركا
نبيٌ أتانا بعد عيسى بناطق
منَ الحقِ فيه الفضلُ فيه كذالكا
أمينٌ على القرآنِ أول شافع
وأولُ مبعوثٍ يُجيبُ الملائكا

## قال نوفل بن الحارث القرشي:

شهدتُ على أنَّ النبيَ محمداً
أتى بالهدى من ربه والبصائر
وأنَّ رسولَ اللهِ يدعوا الى الهدى
وأنَّ رسولَ اللهِ ليسَ بشاعرِ
على ذاكَ أحيى ثم أُبعثُ مُوقناً
وأثويِ عليه ميتاً في المقابر

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكی وەرگێڕ:

إنَّ الحمدَ لله، نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله مِن شرور أنفسنا، ومِن سيئات أعمالنا، مَن يهده الله فلا مضل له، ومَن يضلل فلا هادي له، وأشهد أنْ لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾. [آل عمران: ١٠٢] .

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ [النساء: ١].

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١] .

**أما بعد:**

فإن خير الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار .

**لەپاشاندا: بەڕاستی موسڵمانە بەڕێزو خۆشەویستەكان بەپێویست و گرنگم زانی كەلە كات وساتێكی وەك ئەمڕۆدا ئەم نامیلكە بچووك بەم قەبارەیە و پڕسوودو مانا بەخوێندنەوەی وەبەپاداشتی گەورە بۆئەو كەسەی كە كردار دەكات بەناوەڕۆكەكەی وەرگێڕمە سەر زمانی ڕەسەن و شیرینی كوردی خۆمان بەڵكو هەمووان سودمەند بین لێی بە**

پشتیوانی خوای گەورە ، وە هەروەها بۆ ئەوەی كە چاوڕۆشن وئاگاداربین لەمافەكانی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەسەرمانەوە، وە بۆ ئەوەی بزانین بەوەی كە ئەرك وپێویستە لەسەرشانی هەموو لایەكمان كە پێشەواو خۆشەویست وپێغەمبەرمان محمد ﷺ سەربخەین هەریەك بەگوێرەی تواناو شارەزایی و ئاست ودەسەڵاتی خۆی .

وەك ڕوون وئاشكرایە لەم نامیلكەیەدا باس لەمافەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ كراوە، وە چی پێویستە لەسەر ئەو كەسایەتی ولایەنانە بەرامبەر بەو مافانەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئەنجامی بدەن، بۆیە بە پێویستی دەزانم لەسەرەتادا وپێش ئەوەی كەبچینە ناوبابەتەكانەوە كە چەند ئەركێكی سەر شانی دەسەڵاتدارەكان باس بكەم كە پێویستە لەسەریان كە جێبەجێی بكەن، لەوانە:

یەكەم:دەبێ هەڵسن بە پارێزگاری كردن لە مافەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەمافی گەلە كوردە موسڵمانەكەیان

بەتایبەتی وە موسڵمانانی تریش بەشێوەیەکی گشتی،وە لەڕاستیشدا ئەمە مافی گەلی کوردیشە چونکە کورد زۆرینەی هەرە زۆری موسوڵمانەو شوێن کەوتەی پێغەمبەری ئیسلامنﷺ بەوەی کەرێگری بکەن و نەهێڵن کەلەلایەن هیچ لەدەز گاکانی ڕاگەیاندن وبە ناو ڕۆژنامەنوسان و ڕۆشنبیران و ڕوناکبیران و نوسەرانەوە گاڵتەو سوکایەتی بکرێت بەشتێك لە موقەدەساتی ئەم ئایینی ئیسلامەپیرۆزە، لەسەرووی هەمووشیانەوە گاڵتە کردن بەخوای گەورەو قورئانەکەی وەبەپێغەمبەرﷺ و فەرموودەکانی وسوننەتەکانیوە.

دووەم: سزا سەپاندن بەسەر ئەو شوێن ولایەن و کتێبخانەو چاپخانەو کەسانەی کە لەپشت ئەو نوسین و بڵاو کراوەو پەرتوکانەوەن کە سوکایەتی بەئایینی ئیسلام و پێغەمبەری خۆشەویستمانی تیادا دەکرێت ﷺ .

سێیەم: قەدەغەکرن وڕێگە نەدان بەفرۆشتنی ئەو کاسێت و ڕۆژنامەو گۆڤارو پەرتوکانەی کە سوکایەتی بە موقەدەساتی

ئـەم ئایینـە و پێغەمبەرەکـەی تیـادا دەکرێـت ﷺ، لەبـەر ئەوەی بەتێکڕا دەنگی زانایان کڕین و بڵاوکردنـەوەو ڕیکلام کـردن و فرۆشـتن وچـاپ کـردن و بـارکردن و......هتـد، ئـەو جۆرە کاسێت ونوسراوانە حەرامن وکارێکی نادروستە.

چـوارەم: داوامـان وایـە کـە جـارێکی تـر ڕێگـە نـەدەن بـە کەسـانێکی بـێ دیـن و گـومڕای وەك: مـەریوان هەڵەبجـەیی و هەڵمـەت گـۆران وهاوشـێوەکانیان کـە خـۆیـان و پـەرتوکیان ئازاد بن لە لەکەدارکردنی ئایین و پێغەمبەرەکەمان ﷺ.

پێنجـەم و کۆتـایی: دەبێـت دەسـەڵات و دەسـەڵات داران بڕیارێـك دەربکـەن کـە هەرکەسـێك سـوکایەتی بـەخواو پێغەمبەری خواو ﷺ پیرۆزییەکانی ئیسلام کرد بە توندترین شێوە سزا بدرێت کە لەگەڵ شەرعی خوادا بگونجێت.

لـە بەرئـەوەی پێغەمبـەرمان محمـدﷺ ئەوەنـدە بـەڕێزو خۆشەویستە لەلای خوای گەورە وپاشان موسوڵمانانی

ڕاستگۆوە تەنانەت ئەوەتا خوای گە ورە فەزڵی پێغەمبەری خۆمانی داوەبەسەر هەموو پێغەمبەرانی ترەوە بەوەی کە خوای گەورە تایبەتمەندی بە پێغەمبەرمان محمدﷺ داوە کە بەناوی خۆیەوە بانگی ناکات لە هیچ ئایەتێکی پیرۆزی قورئاندا بە پێچەوانەوە خوای گەورە بانگ لە هەر پێغەمبەرێکی تر دەکات بەناوی خۆیەوە، بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیەی کەکردمان بۆ نمونە:

خوای گەورە دەربارەی پێغەمبەرمان محمد ﷺ دەفەرمووێت:

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ ....﴾ [الأحزاب: ١] .

وە هەروەها: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ...﴾ [المائدة: ٤١] .

بەڵام ئەم تایبەتمەندییە بەکار نەهاتووە بۆ هیچ یەك لە پێغەمبەرانی تر،ئەوەتا خوای گەورە دەربارەی آدم ﷺ دەفەرمووێت لە سەربۆچونێك بەوەی کەئەویش پیغەمبەربووە: ﴿يَا آدَمُ اسْكُنْ ...﴾ [البقرة: ٣٥] .

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر نوح ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ ...﴾ [هود: ٤٨].

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر إبراهیمﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا إِبْرَاهِيمُ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا..﴾ [الصافات: ١٠٤ -١٠٥].

وە هەروەها جارێکی تر دەربارەی پێغەمبەر إبراهیم ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا ...﴾ [هود: ٧٦].

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر موسی ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ...﴾ [القصص: ٣٠].

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر عیسیﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي...﴾ [المائدة: ١١٠] .

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر لوطﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ ...﴾ [هود: ٨١].

وە هەروەها دەربارەی زەکەریا ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ...﴾ [مريم: ٧].

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر یحیی ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ ...﴾ [مريم: ١٢] .

وە هەروەها دەربارەی پێغەمبەر داود ﷺ فەرموویەتی:

﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ ...﴾ [ص: ٢٦] .

ئەم چەند فەرموودەیەی کە هێنامانەوە بەنمونە،بۆ ئەوە بوو کە بزانین خوای گەورە چەندێك پێغەمبەرمانی ﷺ خۆش ویستووە و ڕێزی بۆ داناوە بەسەر پێغەمبەرانی ترەوە چ جای کەسانێك کەلەخوار پێغەمبەرانەوەن علیهم الصلاة السلام .

دەبا ئیتر بە وەفابین بەرامبەر بە خۆی و سوننەتەکانی وە سەری بخەین و ڕێزی بۆ دابنێین و شوێنی بکەوین بەڵکو خوای گەورە بەزەیی و لێخۆشبوونی بەسەرماندا بڕێژێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [آل عمران: ١٣٢].

واتــە: گوێڕایــەڵی خــوای گــەورەو پێغەمبەرەكــەی بكــەنﷺ بەڵكو خوای گەورە بەزەیی وڕەحمی پێتان بێتەوە .

دەبا ئەوانەی تا ئێستا بـەناو ئـایینی ئیسلامەوە بانگەشـەی خۆش ویستنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەكـەن بـزانن ودەسـت هــەڵبگرن لەبیدعەبەگــشتی و وە لەبیدعــەی مــەولودیش بەتایبــەتی چــونكە بەڕاســتی خــۆش ویــستنی پێغەمبــەری خــواﷺ بــەوە نابێــت كــە یــادێكی بیدعــەو داهێنــراو بگێــڕن لەساڵێكدا یەك جار بەناوی خـۆش ویستنیان بـۆ پێغەمبـەری خواوەﷺ.

دەبــا لەبــەر خــوای گــەورە و پاشــان خــۆش ویــستنیان بــۆ پێغەمبەری خواﷺ دەسـت هـەڵبگرن و واز بهێـنن لـەو كـارە نادروستە و چەندەها كاری نادروستی تر.

وە هەروەها ئەو كەسانەی كـە خۆیـان بەهـەڵگری بانگـەوازی ئیسلامی دەزانن كە ناوێكی گەورەیان لـەخۆیان نـاوە بابـەس

بێـــت وازلێهێنـــان وبەســـوك دانانیـــان بـــۆ ســـوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیتر بالەخوا بترسن .

وە كـە ئەمـە رێـزی پێغەمبـەرﷺ بێـت لای خـوای گـەورە، پێویستە ئێمەش بە خۆماندا بچینەوە و بزانین پێغەمبەر ﷺ كێیە؟ وە ئایا كەسێكی وا سادەو ساكارە تاكو بتـوانین ئـاوا زمان درێژی بەرامبەر بكەین ؟! !حاشـا لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سەد جار حاشا.

ئەوەتا خوای گەورە لەبەر مەزنی و رێزی پێغەمبەری خواوە حەرامی كردووە كە بانگی پێغەمبەری خوا ﷺبكەین بـەناوی تەنهایی خۆیەوە وەك دەفەرموێت:

﴿لَا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَـــدُعَاءِ بَعْـــضِكُمْ بَعْـــضًا﴾ [النور:٦٣] .

واتـە: {بـا بـانگ كردنـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە نێوانتانـدا هەروەك بانگ كردنی هەندێكتان بۆ هەندێكی ترتان نـەبێت.} بەداخەوە زۆر جار گوێمان لە بەناو بانگخوازەكان دەبێت كـە

دەڵێن محمد وای ووتووە بەبێ ئەوەی بڵێن پێغەمبەری خوا وە بە بێ ئەوەی صەڵەواتی لەسەر بدەن ، ئەمە خۆی لەخۆیدا بێ ئەدەبیەکی زۆری تێدایە لە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ .

وە لەپێش کۆتایدا دەمەوێت ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم کە کاری من لەم نامیلکەیەدا بریتی بووەتەنها لە: وەرگێڕانی بۆ سەر زوبانی کوردی لە عەرەبیەوە، وە پاشان{تخريج}وە دەرنان ودەرهێنانی فەرموودەکان لەسەرچاوە ڕاستەکانی زانایانی فەرموودەناس وەکو شێخی پایە بەرزو زانای فەرموودەناس و شارەزا لە فیقهو ئاینی خودا شێخ محمد ناصرالدين الألباني (رەحمەتی خوای لێ بێت).

وە بۆیە پێم خۆش بوو کە ئەم بابەتەتان پێشکەش بکەم چونکە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحودا بە هاوەڵەکانی

فەرموو کە ئێمەش دەگرێتەوە: (مَنْ يَرُدُّهُم عَنَّا ولَهُ الجَنَّــة، أو هو رفيقي في الجنة)[١].

واتــە: {هەرکەسـێك بـێ بـاوەڕان بگێڕێتــەوە لێمـان ئــەوە بەهەشـتی بـۆ هەيـە، يـاخود ئـەوە دۆسـت وهـاوەڵی منـە لـە بەهەشتدا.} بۆيەمنيش هەر وەك وەلاَمێـك بۆئـەو بانگـەوازەی پێغەمبەری خواﷺئەم بابەتە بچوکەتان پێشکەش دەکـەم. هيـوادارم جێـی ڕەزامەنـدی خـوای گـەورەو پاشـان ئێـوەی خوێنەری بەڕێز بێت إن شاء الله.

لە کۆتاييدا داواکارم لە خوای گەورە کـە بـە کـردەوەی چـاك لێمــانی وەر بگرێــت و بــەرزی بکاتــەوە بــۆ لای خــۆی، وە هەروەها داوای لیّ دەکەم کەئيسلام وقورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەرەکـەیﷺ سـەر بخـات و پـەرە پێبـدات لەهـەموو جيهاندا وە هەروەها داوای لێدەکەم کە ئەو موسوڵمانە يەکتا

(١) (رواه مسلم في صحيحه: ٤٦١٧ ، باب غزوة أحد).

**پەرست و ڕاستگۆیانەش سەربخات کەلەهەرکوێیەك هەن بۆ خاتری ناوەجوانەکان وسیفەتە بەرزەکانی خۆی.** آمین...

وصلى الله على نبينا محمدﷺ وعلى آله وصحبه أجمعين .

**باوكی مسلم /٠٧٧٠١٢١٢٥٤٥**

**چەمچەماڵ/ ڕۆژی پێنج شەممە**

ربيع الثاني **١٤٢٨/٤/٢٤ هـ**

**بەرامبەر ١٠ /٢٠٠٧/٥ مـ**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی نوسەر:

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

**لەپاشاندا:**

**بەڕاستی یەکەم پایە لەپایە گەورەکانی ئیسلام:**

شـايەتيدانە بـەوەی كـەهيچ پەرسـتراوێك نـیيـە شايـستەی پەرسـتن بێـت بـە حـەق جگـە لـەخودا نـەبێت، وەمحمـديش (ﷺ)پێغەمبەری خودايە. وەجـێ بـەجێكردنی بەشـی دووەم لـــەم دوو شـــايەتيدانە ئـــەويش شـــايەتيدانە بـــەوەی كـــە محمـد(ﷺ) پێغەمبـەری خودايـە ئـەم شـايەتيدانەش تـەواو وجێبەجێ كراو دەبێت لەميانەی ئەم فەرمانانەی خوارەوە:

يەكەم: بەراستگۆ دانـانی پێغەمبـەر لەهـەر شـتێك كەهـەواڵی لەبارەوە دابێت، وەسەرەتايی ترينيـشيان بـەوە دێتـە جـێ : بڕوات وابێت بەوەی كە ئەو پێغەمبەرو نێردراوی خودايـە بـۆ هـەموو جنۆكـە و مرۆڤـەكان بـەتێكڕا بـۆ گەيانـدنی سروشـی خودا، ئـەويش قورئـان وفەرموودەكانـە كەپێكهاتـەی ئـايينی ئيسلامن، ئەو ئايينـەی كـە خـوای گـەورە هـيچ ئـايينێكی تـر وەرناگرێت جگە لەو نەبێت .

دووەم: گوێڕايەڵی كردنـی پێغەمبـەری خـوا و ڕازی بـوون بـە فەرمان ڕەوايەتيەكەی، وە خۆبەدەستەوەدان بۆحوكمـەكانی

بــە خۆبەدەســـتەوەدانێكی تــەواو، وەملكــەچ بــوون بـــۆ سـونننەتەكانی و پـەیڕەوی كردنیـان لەخۆتـدا، وە فڕێـدان و دووركەوتنەوە لە وشتانەی كەجگـە لـە سوننەتەكانی ئـەون (ﷺ).

<u>سێیەم</u>: خۆش ویستنی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەسـەرووی خـــۆش ویـــستنی بـــاوك ودایـــك ومنـــداڵ و گیانەوەیـــە، وە خۆشویستنی ئەوەت لـێ داوا دەكـات كـە بەگـەورەی بزانیـت وڕێـزی لـێ بگریـت وسـەری بخـەیت وبـەرگری لـێ بكـەیت، وەخۆت پەیوەست بكەیت بەوشتانەی كە لەوەوە هاتوون.

<u>چـوارەم</u>: دەســـت هـــەڵگرتن ووازهێنـــان لەوشـــتانەی كـــە پێغەمبەری (ﷺ) قەدەغەی كردووە وە دەڵێت مەیكـەن، وە هەروەها دەبێت پەرستن نەكرێت بۆخودا جگـە بـەو شـێوەیە نـەبێت كـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دیـاری كردووەبۆمـان، وەلەسـەر هـەموو موسـڵمانێكە كەپەلـە بكـات بـۆجێبـەجێ كردنی ئـەم واتایـە، بۆئـەوەی بڕوا بوونەكـەی راسـت وڕەوان

بێت، وەبۆ ئەوەی بەشی دووەم لەوشەی یەكخواپەرستی جێبەجێ بكات، وەبۆ ئەوەی شایەتی دانەكەی تەواو بێت بەوەی كە موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە

لەبەر ئەوەی دووڕووەكان دەیان ووت وەك خوای گەورەلەقورئاندا ئاماژەی پێكردووە:

﴿نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ [المنافقون: ١].

واتە: {ئێمە شایەتی دەدەین بەوەی كەتۆ پێغەمبەری خودایت، وەخودایش دەزانێت كەتۆ پێغەمبەری خودایت، وەخوداشایەت وئاگادارە بەوەی كەدووڕووەكان درۆ دەكەن}.

دووڕووەكان شایەتی دانەكەیان سودیان پێ ناگەیەنێت لە قیامەتدا ، لەبەر ئەوەی واتاكەیان جێ بەجێ نەكردبوو، وەلەپاشاندا موسوڵمانانی بەڕێز ئەمەش چەند شتێكە كەدەتوانین لەئەنجامیاندا كردار بكەین بەخواست

وداواكارێیـــەكانی ئـــەو خۆشەویـــستیەمان بـــۆ پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ)، وە ئـەوەی كەئـەرك و پێویـستە لەسـەرمان كـە ئەنجامی بدەین وەدەبێت هەڵبسین بە جیّ بەجیّ كردنی ئـەو مافەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كە بەسەر هـەموو تاكێكمانـەوە هەیەتی ئەویش بەوە دەبێت كە گیان و ماڵ و منداڵ و مـاڵ و هەمووشتێك بكەینە قوربـان و فیـدای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەبەرامبەر ئەو هـەموو هێرشـە تونـد و چـڕانەی كـە دەكرێنـە سـەری ، هـەموو كەسـێك لـە ئێمـە دەبێـت بـەرگری لێ بكـات بـەگوێرەی توانـــای خـــۆی ، بۆیـــە هـــەمووان بەرپرســـیارێتی دەگرینـــە ئەســـتۆ لەبەرامبـــەر پاراســـتن و بـــەرگری كـــردن لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) بەگوێرەی ئاست و توانـاو ئـەو پلـەو پایەیەی كە تیایدایە :

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی تاك:

١ـ تێڕامـان و بیرکردنـەوە لـەو نیشانەو بەڵگانـەی کـە حاشـا هەڵنـەگرن و بەڵگـەی تـەواون لەسـەر پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـەوەی کەئـەو پێغەمبـەری خـودای پـەروەردگاری هـەموو بوونـەوەر وجیهانـە، وەبنـچینەی بەڵگـەکانیش لـەقورئانی پـیرۆزەوە سەرچـاوەیان گرتـووە، وەیـان هـەر شـتێك کـە ببێـت بەبەڵگـە لەسـەر ڕاسـتێتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

٢ـ فێربوون و ناسینی ئەو بەڵگانەی لـەقورئان و فـەرموودە و کۆ دەنگی زانایاندا هاتووە کەبەڵگەن لەسەر پێویست بوونی گوێڕایەڵی کردن وشوێن کەوتن وپەیڕەوی کردن و خۆچواندن بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) .

٣ـ زانست وزانیاریت هەبێت بەوەی کە خوای گەورە سوننەت و فەرمودەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پاراستووە، خـوای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ [الحجر: ٩].

واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووە، وەئێمە هەر خۆشمان دەیپارێزین.

ئەویش لەمیانەی ئەو كۆششە گەورانەوە پارێزراوە كە زاناكان پێی هەڵساون بەدرێژای سەردەمە جیاوازەكان، كەڕاستیان لە لاوازی جیاكردۆتەوە،وە لەسەر ووردترین بنەما كۆیان كردۆتەوەئەویش یەكێكە لەتایبەتمەندیەكانی ئەم ئوممەتەكە بەتەنها پێی هەڵساون جیاواز لە ئوممەتانی پێشووتر.

٤- هەست لادروست بوون بەخۆشویستنت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدڵدا ئەویش بەیاد كردنەوەی جوانترین سیفات و تایبەت مەندیەكانی دەبێت لەڕووی ڕواڵەت ودروست بوونی و خوڕەوشتیەوە، وە ئەو پەرتوكانەی كەباس لەخوڕەوشتەجوان وبەرزەكانی دەكات،هەوڵبدەین بیان خوێنینەوە بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای ژیانی بین وە بەڕاستی

پێغەمبەری خوا(ﷺ)تەواوی واتای مرۆیی تیادا كۆببووەوە لەڕووی شێوازو ڕوخسارو ڕەوشتیدا:

خودا فەرموویەتی : ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ [القلم: ٤].

واتە: بەراستی تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) لەسەرووی هەموو خوڕەوشتە بەرزو گەورەكانەوەیت .

٥- بەبیر هێنانەوە وباس كردنی گەورەیی چاكەو دەست گرتن ویارمەتی دانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر هەریەك لەئێمەی موسڵماندا، لەبەر ئەوەی ئەو بوو ئایین و پەیامی خوای گەورەی گەیاند بەئێمە بەچاكترین وتەواوترین شێوە، بەدڵنیایی‌یەوەو بەبێ كەموكوڕی پەیامەكەی خودای گەورەی گەیاند و ئەمانەتەكەشی جێ بەجێ كرد و ئامۆژگاری ئوممەتەكەیشی كرد .

٦- هەموو شتێكی چاك و بەسوود كاتێك كە بۆمان ئاسان دەبێت و دەستمان دەكەوێت بیدەینە پاڵی و بڵێین بەهۆی پێغەمبەری خواوەیە(ﷺ) لەدوای فەزڵ و گەورەیی و

پێزانینی خوای گەورەوە کە پێمان دەدرێت ئینجا ئەگەر هات و ئەوشتە بۆ دونیامـان سوودمان پـێ بگەیـەنێت یاخود بۆ دوارۆژمان لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەچارەمان بوو بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان وە ڕێنمایی کارمان بوو بۆ ئەو ڕێگە ڕاستەی کە بانگەوازی بۆ دەکرد، دەی خودای گەورە پاداشتی بداتەوە لەجیاتی ئێمە بەچاکترین پاداشت کە پاداشتی پێغەمبەرێکی دابێتەوە لە جیاتی ئوممەتەکەی ونێردراوێك لەجیاتی نەتەوەکەی .

٧- دەبێت ئەو بڕوایەمان لا دروست ببێت بەوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)بەسۆزترو بەبەزەیی ترو بەهۆڵ ترە بۆ ئوممەتەکەی لە خوودی ئوممەتەکەی:

﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ [الأحزاب: ٦] .

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەپێش ترو نزیك ترو بەبەزەیی ترو بەجۆشترە بۆ بڕواداران لەنەفس وگیانی خۆیان بۆ خۆیان .

٨- هەوڵبدەین ئاشناو شارەزا ببین لەو ئایەت و فەرموودانەی کە بەڵگەن لەسەر مەزنی پلەوپایەو ڕێز و شوێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلای پەروەردگار و دروستکەرەکەی وە ئەوەش بزانین کە خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ)زۆر خۆش ویستووە و ڕێزی بۆدناوە بەتایبەتترین شێوە .

٩- پەیوەست بوون بەو فەرمانانەی خوای گەورەوە سەبارەت بەوەی کە دەبێت پێغەمبەری خوامان(ﷺ) خۆش بوێت ، بەڵکو دەبێت خۆش ویستنمان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش خۆش ویستنی نەفس وگیانمان بکەین، بەبەڵگەی ئەوفەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی کەدەفەرموێت: (لايؤمنُ أحدُكُم حتى أكونَ أحبَّ إليهِ مِنْ ولدِهِ ووالدِهِ والنَّاسِ أجمعين)[٢].

(٢) (صحيح مسلم: ١٦٧، باب الإيمان)، و(صحيح الجامع الصغير: ٧٥٨٢، باب الإيمان)، و(صحيح ابن ماجة:٥٦، باب الإيمان).

واتە : هیچ کەسێك لەئێوە ئیمان و بڕوای تەواو نییە تاکو منی لە ماڵ و منداڵ و دایك و باوك و هەموو خەڵكی خۆشتر نەوێت .

١٠- پەیوەست بوونمان بەو فەرمانانەی خوای گەورەوە دەربارەی بەڕەوشت بوونمان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) وسوننەتەکانیدا، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی کە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ [الحجرات: ٢].

واتە: ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە دەنگی خۆتان مەخەنە سەروی دەنگی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، وەلەگەڵ ئەو بەدەنگی بەرز قسە مەکەن هەروەکو چۆن لەگەڵ یەکتردا قسە دەکەن، نەوەکو ئاکامی کارتان تیا بچێ، وەئێوەش هەست وئاگاداریتان نەبێت .

وەهەروەها دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[الحجرات: ٣]

واتە: { بەڕاستی ئەوانەی کەلەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنگیان نزم دەکەنەوە ئەوانە کەسانێکن کەخوای گەورە دڵیانی تاقی کردۆتەوە بەلەخواترسان، -هەروەك چۆن ئاڵتون تاقی دەکرێتەوە وبەئاگر ئاڵتونە سادەکەی لێ جیا دەکرێتەوە- ئەوانە لێخۆش بوون وپاداشتی گەورەیان بۆ هەیە }.

وەهەروەها دەفەرموێت:

﴿لَاتَجْعَلُوا دُعَاءَالرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا﴾[النور:٦٣]

واتە: بانگ کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێوانتاندا وەکو بانگ کردنی هەندێکتان بۆ هەندێکتان دامەنێن .

١١-خۆبەدەستەوەدان و ملکەچ بوون بۆ ئەو فەرمانانەی خوای گەورەکە ئاماژەن بەوەی کە دەبێت ئێمەی موسڵمان بەرگری بکەین لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە هەروەها دەبێت

سەری بخەین و پارێزگاری لێ بكەین لە هەر ناخۆشی و ناڕەحەتییەك كە بیانەوێت تووشی بكەن ، وە یاخود لەهەر نوقستانی و كەمتەرخەمییەك كە بیدەنە پاڵی ، هەروەك چۆن خوای گەورە فەرموویەتی:
﴿لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾ [الفتح: ٩].
واتە: تابەخواو پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بڕوا بهێنن وە یارمەتی پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بدەن وە سەری بخەن و ڕێزی بۆ دابنێن وبەگەورەی بزانن.
١٢- بوونی نییەتێكی ڕاستگۆیانە ودرێژەدان وبەردەوام بوون لەسەر ئەو نییەتە بۆ سەرخستن وپاراستن وبەرگری كردن لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).
١٣- بڕوا لا دروست كردن وهێنانە بیری پاداشتێكی زۆر زۆر گەورە لەدوا ڕۆژدا بۆ ئەو كەسەی خۆشویستنی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) جێبەجێ كرد بێت بەشێوەیەكی ڕاست وڕەوان، بەوەی ئەو كەسە دەبێت بەهاوڕێ وخۆشەویستی پێغەمبەری

خــوا(ﷺ) لەبەهەشــتدا ،بــەو فەرمایــشتەی پێغەمبــەری خوا(ﷺ) کە کاتێك کابرایـەك ووتـی مـن خـوا و پێغەمبـەری خوام(ﷺ) خۆش دەوێت پێغەمبەری خوا(ﷺ)پێی فەرموو: (أنتَ معَ مَن أحْبَبْتَ)[٣] .

واتە: تۆ لەگەڵ ئەوکەسەدایت و حەشر دەکرێیـت لـەدوارۆژدا کەخۆشت دەوێت.

١٤- سوربوون وبەردەوام بوون لەسەر صـەلاوات دان لەسـەر پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هـەرکاتێك کـەباس کـرا، وەهـەروەها لەدوای بانگ دان ولـە ڕۆژی هەینیـدا، وە لـە هـەموو کاتێکـدا لەبــەر ئــەوەی پاداشــتێکی زۆر گــەورە ئامــادەکراوە بــۆ ئەوکەســانەی کــە صــەلاوات دەدەن لەســەر پێغەمبــەری خــوا(ﷺ)، ئــەویش لەبــەر گــەورەیی مــافی پێغەمبــەری خواوەیە(ﷺ) بەسەرمانەوە .

(٣) (صحيح البخاري: ٦١٧١)، و(صحيح مسلم: ٢٦٣٩)، و(صحيح الجامع الصغير: ١/١٤٨٣).

١٥- خوێندنەوەی ژیان نامەیەکی راستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ وەستان لەسەر رووداوەکان وەستانی کەسێکی سودمەند لە حوکم و ڕووداوو پەندەکان، وەلەگەڵ سود وەرگرتن لەو سودانەی کەدەرهێنراون لەهەر ڕووداوێك لەو ڕووداوانە، وەهەوڵیش بدرێت بەپەیوەست کردنی‌یەوە بەژیان وسەردەمی خۆمانەوە.

١٦- فێر بوون وشارەزا بوون لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وە بەتایبەت خوێندنەوەی ئەو فەرموودانەی کەخاوەن زانستەکان بەڕاستیان داناوە لەو فەرموودانەی کە گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەگەڵ هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەو فەرموودانە،وە بایەخدان و لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو دانایییە بەنرخ و ڕەوشتە بەرزو پەرستش و ملکەچی یە تەواوانەی کە تەنها دەبێت بۆ خوای گەورە و دروستکەر ئەنجام بدرێت کەئەویش لەو فێرخوازی و ڕێنماییە

پێغەمبەریانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بومان دەردەکەوێت وفێری دەبین کەفەرمودەکەلە خۆی گرتبوون .

١٧- شوێن کەوتنی هەموو سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ لەپێش دانانی کام لە هەموو گرنگ ترو پێویست تر لەوانی تر.

١٨- سور بوون لەسەر شوێن کەوتن وپەیڕەوی کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسوننەتەکانیدا، بائەگەر بێت و ئەو سوننەتە لەتەمەنماندا یەك جاریش جێبەجێی بکەین ئەویش لەبەر گرنگیدان و سوربوونمانە لەسەر شوێن کەوتەیی کردن بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لە هەموو شتێکدا .

١٩- خۆپاراستن ودوور کەوتنەوە لەگاڵتە کردن بەشتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٢٠- دڵ خۆش بوون بە بڵاو بوونەوە و دەرکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێوان خەڵکیدا .

٢١- دڵ تەنگبوون وپێ ناخۆش بوون بە دیار نەمانی هەندێك لە سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێو هەندێك لەخەڵكیدا .

٢٢- دەبێت ڕقت لەهەر ڕەخنە گرو توانج دەرێك بێت كاتێك كە ڕەخنە بگرێت و توانج بدات لە خودی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یاخوود بەشتێك لەسوننەتەكانی.

٢٣- خۆشویستنی ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەخاو و خێزان و وەچەكانییەوە، وە هەوڵ بدەیت خۆت نزیك بكەیتەوە لە خوای گەورە بەهۆی خۆشویستنی خوای گەورەوە بۆ نەوەو وەچەكانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەویش لەبەر خاتر نزیكیانەوەیە لە پێغەمبەری خواو (ﷺ)وە لەبەر موسڵمان بوونیشیانە بەئایینی پیرۆزی ئیسلام ، وە هەركەسێكمان بینی لەوان یاخی ببوون هەوڵ بدەین ڕێنماییان بكەین لەبەر ئەوەی ڕێنمایی كردنی نەوەو وەچەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویست تربوو لەلای

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕێنمای كردنی جگە لەوان، هەروەك چۆن ئیمامی عومەری كوری خەتتاب (رضي الله عنه) بە عەبباسی مامی پێغەمبەری (ﷺ) ووت:

(مهلاً ياعباس لَإسلامُكَ يومَ أسلمتَ كانَ أحب لي من إسلام الخطاب، ومالي إلا أني قد عرفت أن إسلامَك كان أحبّ الى رسول الله (ﷺ) من إسلام الخطاب)[٤] .

واتە: لەسەرخۆبە ئەی عەبباس (رضي الله عنه) سوێند بە خوا بە موسڵمان بوونی تۆ كاتێك كە ئەورۆژەی موسڵمان بوویت، خۆشەویست تر بوو لەلام لە موسڵمان بوونی خەتتاب، وەمن بۆیە پێم خۆشتر بوو بەس تەنها لەبەر ئەوەی كەزانیتم موسڵمان بوونی تۆ خۆشەویست ترە لەلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەموسڵمان بوونی خەتتابی باوكم .

•

(٤) (تفسير ابن كثير في سورة الشورى: ص٢٥٤٥)، و(ابن سعد في الطبقات: ٤/٢٢-٣٠).

٢٤- کارکردن بەوەسیەت نامەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبارەی خاوخێزان و وەچەکانی‌یەوە، کاتێك کە فەرمووی: (أذَكِّرُكُمُ اللهَ في أهلِ بَيتِي)[٥] ثلاثاً.

واتە: (دەتانترسێنم بەخوای گەورە و خوداتان یاد دەکەمەوە بەوەی کە ئاگاتان لە خاوخێزان و وەچەکانم بێت) سێ جار دووبارەی کردەوە .

٢٥- خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە ڕێز بۆ دانانیان، وە بڕوا بوون بەچاکە و فەزڵیان بەسەر ئەوانەی کە لەدوای ئەوان هاتوون، لەڕووی زانست وکردارو پلەو پایەیان لەلای خوای گەورە، وەڕق لێبوونی هەر کەسێك کە توانجیان لێ بدات وسوکایەتیان پێ بکات، یاخود لە پلەو پایەو ڕێزیان کەم بکاتەوە .

٢٦- خۆشویستنی زانایان وڕێز بۆ دانانیان، ئەویش لەبەر پلەوپایەو پەیوەندییانەوەیە بەمیرات گرێتی پێغەمبەرانەوە،

---

(٥) (صحيح مسلم: ٨/٦١٧٥)، و(الدارمي: ٣٣١٦).

وە لەبەر ئەوەی زانایان میرات گری پێغەمبەرانن، بۆیە مافی خۆشویستن وڕێز بۆ دانانیان هەیە، کەئەویش یەکێکە لە مافەکانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بەسەر ئوممەتەکەیەوە.

## سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی خێزان وکۆمەڵگە:

٢٧- پەروەردە کردنی نەوەکان لەسەر خۆشویستنیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

٢٨- پەروەردە کردنی نەوەکان لەسەر پەیڕەوی کردنیان وخۆچوواندنیان بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەهەمووکار وکردارو کاتەکانی ژیانیاندا .

٢٩- بوون و وەدەستنانی ئەو پەرتوکانەی کەدەربارەی ژیان نامەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) نوسراون .

٣٠- بوون و وەدەستنانی ئەو شریت وکاسێتانەی کەدەربارەی ژیان نامەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەدوێن.

٣١- وەدەستنان وهەڵبژاردنی ئەوفیلمەكارتۆنیانەی كە پـلان وبەرنامەیەكی ڕوونی تیادایە لەپەروەردەكردندا[*].

٣٢- تەرخان كردنی وانەیەك بێت یاخود زیاتر لە وانەیەك لە هەفتەیەكدا دەربارەی ژیان نامـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، وە خاو و خێزانیشی لەدەور كۆبكرێتەوە بۆ سـوود وەرگـرتن و شارەزابوون لە ژیانی پیرۆزی .

٣٣- شـوێن كەوتـەیی كـردن و خۆچـواندنی پیـاوان بـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) لەمامەڵـە كردنیانـدا لەگـەڵ خـاو وخێزانیاندا.

٣٤- هاندانی نەوەكان بۆ لەبەر كردن وجێ بەجێ كردنی ئەو ویردانـەی كەلـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) بـە صـەحیحی هاتوون .

---

(*) لەگەڵ بوونی هەندێك تێبینیشمان لەسەر ئەم خاڵە .

٣٥- هاندانی نەوەکان بۆ لادانەلاوەی بەشێك لە خەرجی ڕۆژانەیی‌یان لەپێناو جێ بەجێ کردنێکی کردەوەیی بۆ هەندێ لە فەرموودەکان، وەکو زامن کردن ودەستە بەر کردنی هەتیوان، وە نان پێدان و،وە یارمەتی دانی هەژاران ونەداران.

٣٦- ڕاهێنان و فێرکردنی و نەوەکان لەسەر بەکارهێنانیان بۆ چیرۆك و نموونە پێغەمبەرییەکان لە فەرموودەدا، وەکو: (المؤمِنُ كَيِّسٌ فَطِن)[٦] .

واتە: بڕوادار تێگەیشتوو وریاو ژیرە .

(٦) حديث موضوع، انظر: (ضعيف الجامع الصغير: ٥٩٠٤)، و(سلسلة الأحاديث الضعيفة: ٧٦٠).

(لا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَينِ)[٧].

واتە: بڕوادار دوو جار لە کونێکەوە پێوەی نادرێت.

(يَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا )[٨] .

واتە: ئاسان کار بن نەك قورس کار.

٣٧- دانانی پێش پڕکێ خێزانی‌یەکان دەربارەی ژیان نامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

٣٨- پێناسین و شارەزا کردنی خێزانە موسڵمانەکان بەژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمیانەی جێ بەجێ کردنی پـرۆژەی: رۆژێك لەماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

(٧) (صحيح الجامع الصغير: ٢/ ٧٧٧٩)، و(سلسلة الأحاديث الصحيحة: ١١٧٥)، و(صحيح ابن ماجة: ٣/ ٣٢٣٢، ٣٢٣٣) .

(٨) (صحيح الجامع الصغير: ٨٠٨٦، ٨٠٨٧ )، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ١١٥١)، و(صحيح مسلم: ٨/٤٥٠٣).

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی بەشەكانی فێركردن وفەرمانبەرانی:

٣٩- ڕوواندن وچاندنی خۆشویستنی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لـەدڵی قوتابیـانی كـوڕ وكـچدا، لەمیانـەی دەرخـستنی مـافی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر ئوممەتەكەیەوە.

٤٠- زۆر بەسـتنی ئـەو كۆڕانـەی كەچـەند لایـەنێك لـەژیان و كەسایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەخەنە ڕوو.

٤١- هاندانی بەرپرسانی بەشەكانی فێركردن بۆ زیـاد كردنـی وانەیـەك لەسـەر ژیـان نامـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)بـۆ پرۆگرامـەكانی فێركـردن وتوێژینـەوە ئیـسلامیەكان لەبەشـە پسپۆڕیـیە مرۆیـیەكان .

٤٢– كاركردن بۆ دەوڵەمەند كردن و بەخشین لە پێناو دانانی چەند مینبەرێك بۆ توێژینەوەی ژیان نامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)لەدانیشگا رۆژئاوا بەناوبانگەكاندا.

٤٣– هاندانی لێكۆڵەرەوانی زانستی لەبواری ژیان نامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشێوەیەكی تایبەتی وە لێكۆڵەرەوانیش بەشێوەیەكی گشتی بۆ دانان وئامادە كردنی ئەو پەرتوكانەی كەلەبواری فەرموودەدا نووسراون بەچەندەها ئامادەكراوی جۆراو جۆر وەكو: {المغازي}واتە: باسی كردارەكانی جەنگاوەر سیفەتەكانیان، وە {الشمائل} واتە: باسكردنی خوڕەوشت وڕەفتار.

٤٤– كاركردن بۆ كردنەوەی پێشانگا لەقوتابخانە وزانكۆكان كەببێتە هۆی ناساندنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لەگەڵ ڕەچاو كردن و نیشاندانی نمونەیەكی جوگرافی سەبارەت بەچۆنێتی سەر هەڵدان و گەشە كردنی ئیسلام.

٤٥– تەرخان كردنی گۆشەیەكی تایبەت لەكتێبخانەكاندا، كە سەرجەم ئەو بابەتانە بگرێتە خۆ كە پەیوەستن بە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ژیان نامەکەی وە گرنگیشی پێ بدرێت و لەشوێنێکی دیار وبەرچاوی دابنرێت .

٤٦- کارکردن بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگێکی ئەکادیمی دەوڵەمەند سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە گونجاو بێت کە وەك سەرچاوەیەك بەکاربهێنرێت وە وەریش بگێڕدرێت بۆ چەندەها زمانی جیهانی.

٤٧- بەرپا کردن ودانانی پێش بڕکێیەکی ساڵانە بۆ قوتابیانی کوڕ وکچ بۆ باشترین لێکۆڵینەوە لەبواری ژیان نامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، وەهەروەها کۆمەڵە خەڵاتێکی بەنرخیشی بۆ تەرخان بکرێت .

٤٨- دانانی خێوەتگەی لاوان کە ئەوکۆمەڵە چالاکیانە لەخۆبگرێت کەدەبێتە هۆکاری چاندنی خۆشویستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدڵەکاندا وە هەروەها ببێتە هۆکاری پەیوەست بوونیان بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) .

٤٩- دانـان وكردنـەوەی خـولی ڕاهێنـانی تایبـەت بۆئامـادە كردنی سەرپەشتیكارانی پۆلەكان بۆ پەیڕەوی كردنیان و خۆ چواندنیان بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) .

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی پێشەوایان وبانگەواز كاران وقوتابیانی زانست:

٥٠- ڕوون كردنـــەوەی تایبـــەت مەندیـــەكانی بانگـــەوازو پەیامەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، بەوەی كە ئەو نێردراوە لەلایەن خوای گەورەوە بـەئاینێكی{الحنيفية}واتـە: واز هێنـان لەهاوبـەش بۆخـوا بڕیـاردان وڕوو كردنـە خـوای گـەورە لـە یەكخواپەرستیدا، وە{السمحة}واتە: هیچ نارەحەتی وقورسی وگرانـــیـــەكی تێـــدا نـــیـــە، وەمەبەســـتی ســـەرەكیش لەبانگەوازەكـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـور بـوونی بـوو لەسـەر ڕێنمـای كردنـی خـەڵكی بـەتێكڕا بـۆ تـاك كردنـەوەی پەرستەكان بۆ خوای بەندەكان .

٥١- کار کردن بۆ بانگەواز کردنی خەڵکی و ڕێنمایی کردنیان بۆ لای ئەم ئایینە بەتێکڕای ڕەگەزو هۆزەکانیانەوە.

٥٢- ڕوون کردنـــەوەو دەرخـــستنی هـــەموو ســـیفات و ئاوەڵناوەکـــانی پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) لـــەرووی دیمـــەن ورەوشتی‌یەوە، پێش بوون ودوای بوونی بە پێغەمبەر(ﷺ).

٥٣- ڕوون کردنـــەوەو خـــستنەڕووی فـــەزڵ و چـــاکە کـــانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە تایبەت مەندیەکانی ئوممەتەکەشی بەشێوەیەکی جوان .

٥٤- ڕوون کردنەوەو دەرخـــستنی هەڵوێست و مامەڵـەکردنی پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) لەگـــەڵ خێـــزان وهاوســـێ وهاوەڵەکانیدا(رضي الله عنهم).

٥٥- ڕوون کردنـــەوەی چـــۆنێتی مامەڵـــە کردنـــی پێغەمبـــەری خوا(ﷺ) لەگەڵ دوژمنەکانیدا لەگاورو جولەکەو هاوبەش بـۆ خوا بڕیاردەر ودووڕووەکان.

٥٦- ڕوون کردنـــەوەی بەرنامـــەو پرۆگرامـــی ژیـــانی ڕۆژانـــەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٥٧- تەرخان كردنی وتاری دووەمی هەندێ لەجومعەكان بۆ بە بیرهێنانەوەی هەندێك لە ڕووداوەكانی ژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوە سەرەڕای كە دەبێت چەندەها وتاری تری تەواو وتایبەت تەرخان بكرێت بۆ باسكردنی ژیان نامەكەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەكاتێكەوە بۆ كاتێكی تر بەكوێرەی ڕووداوەكان.

٥٨- پەیوەست بوون ودڵ لابوون بۆ ئەو ئایەتانەی كە باس لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەكەن لەكاتێكدا كەلەنوێژدا دەخوێندرێت بۆماوەی سێ تا پێنج خولەك (*).

٥٩- زیاد كردنی كۆمەڵە بازنەیەك بۆ لەبەر كردنی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەپاڵ بازنەكانی لەبەر كردنی قورئانی پیرۆز لە مزگەوتەكاندا.

٦٠- ڕاست كرنەوەی ئەو بۆچوونە هەڵانەی كەلەلای زۆرێك لە خەڵكی دروست بووە دەربارەی سوننەتەكانی پێغەمبەری

خواوە(ﷺ)، وەهەروەها بانگەواز بكرێت بۆ دەست گرتن بەو سوننەت و فەرموودانەی كە ڕاستن و صەحیحن بەشێوازێكی ئاسان وڕوون.

٦١- بە بیرهێنانەوە و باسكردنی فەتوای زانایانی ئەم ئوممەتە بۆموسوڵمانان وگوێگرانت،بەتایبەت ئەوفەتوایانەی كە سەبارەت بە حوكم وسزای ئەو كەسانەی كە قسەو سوكایەتی بە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە دەكەن (ﷺ) تەنانەت ئەگەر بابێت و قسە و سوكایەتیەكی كەمیش بێت وە هەروەها بۆموسوڵمانانی ڕوون بكەیتەوە بەوەی كەواجب وپێویستە لەسەریان لە بەرامبەربەو كەسانەی كە ئەوە ووتەو ڕەفتاریان بێت بەرانبەر بە خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەوەی دەبێت كە ڕقیان لێیان بێت و خۆیان لییان بەری

بكەن و حاشایان لێ بكەن و وە لە ڕیزی موسوڵمانانیش نەیانژمێرن (*).

٦٢- كار كردن بۆ گێڕانەوەی خەڵكی بۆ لای ئایینەكەیان ئەویش لەمیانەی خستنەڕوویەكی تێروتەسەلەوەدەبێت بۆ هەڵوێستە بانگەوازكارییەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

٦٣- وریاكردنەوەو هۆشداری دان بەخەڵكی سەبارەت بەهۆكارە بینراو و بیستراو و خوێندراوەكان لەزیاد ڕەووی كردنیاندا بەپێغەمبەری خوادا(ﷺ) وە هەروەها ئەو ئایەتانەشیان بۆ ڕوون بكرێتەوە كە باس لەحەرامێتی زیادڕەووی كردن دەكەن بۆ نموونە یەكێك لەو ئایەتانە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿.....لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ .....﴾ [النساء: ١٧١].

---

(*) دیارە ئەوەی كە ڕوون و ئاشكرایە لەلای زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە بە تایبەت لەلای چوار مەزهەبەكە سەبارەت بەحوكم و سزای ئەوكەسانەی كە سوكایەتی بە خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەكەن بەوەی كە ئەو كەسانە كەسانێكی هەڵگەڕاوەن و دەبێت بكوژرێن ئەگەردەسەڵاتی دەسەڵاتی موسوڵمانان بو.

واتە: زیادەڕەوی مەکەن لەئایینەکەتاندا.

وە بەهەمان شێوە ئەو فەرموودانەش باس بکەیت کە تایبەتن بەم بوارەوە ، بۆ نمونە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە دەفەرموێت :

(لاتُطْرُونِي كَمَا أطرَتِ النَّصارَى ابنَ مَرْيَمَ)[٩].

واتە: لەسنوری خۆم بەرزم مەکەنەوە و پیامدا هەڵ مەدەن، هەروەك چۆن گاورەکان عیسای کوڕی مەریەمیان (ﷺ) لەسنوری خۆی دەرکردو پێیدا هەڵیان دا.

وە هەروەها ڕوونیشی بکەیتەوە کەخۆشویستنی ڕاستگۆیانەو ڕاستەقینەش بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەشوێن کەوتنی دەبێت ، وە دەبێت خەڵکیش ئاگادار بکەیتەوە لە زەرەرو زیانی بیدعەچیەکان و شوێنکەوتوانی هەواوئارەزووی خۆیان.

٦٤- هانی خەڵکی بدەیت بۆ ئەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بخوێننەوە لەسەرچاوە ڕاستەکانیەوە ، وە

---

(٩) (صحيح الجامع الصغير: ٧٣٦٣/٢).

هەوڵیش بدە ناونیشانی ئەو سەرچاوە و پەرتووکانەیان پێ بناسێنیت کە باس لە ژیاننامەی دەکەن .

٦٥-پوچەڵ کردنەوە و بەدرۆ خستنەوەی ئەو گومان وقسە پڕوپوچانەی کەوا دەورژێندرێت سەبارەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ژیان نامەکەی .

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی ڕووناکبیران و ڕۆشنبیران وڕاگەیەنەران و ڕۆژنامە نووسان:

٦٦- دەرخستنی کەسایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتایبەت مەندییەکانی ئوممەتەکەی لەمیانەی بڵاو کردنەوەکانیاندا ، وەهەروەها باس و گفتوگۆش بکرێت لەو بوارەوە بەتایبەت لەبۆنەکانی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیریدا.

٦٧- بڵاو نەکردنەوەی هەر بابەتێك کەسوکایەتی کردنی تێدا بێت بەسوننەتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٦٨- بەرەنگار بوونەوەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی وجولەکە دوژمن کارەکان، وە هەروەها بەرپەرچی ئەو گومان و پڕوپاگەندانەش بدرێتەوە کە سەبارەت بەئایین و پێغەمبەرەکەمان (ﷺ) دەیوروژێنن.

٦٩- بەستنی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنی وڕوناکبیری لەگەڵ دادپەروەرانی غەیرە موسڵمانەکان وە هەروەها قسەو گفتوگۆ بکرێت لەگەڵیاندا دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) و پەیامەکەی.

٧٠- بڵاو کردنەوەی ئەو شتانەی کەدادپەروەرە غەیرە موسڵمانەکان ووتویانە سەبارەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)(*).

٧١- بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەی ڕوناکبیری بۆ خستنەڕووی بەرنامە وژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)وە هەروەها ئەوەش ڕوون بکەیتەوە کە بەرنامەو ڕێبازەکەی پێغەمبەری خواگونجاو و شیاوە بۆ هەموو کات و سات و شوێنێك.

---

(*) مەبەست بەو ووتانەیانە کە بەباش و حەق و پیاهەڵدانە ووتویانە لەبارەیەوە (ﷺ).





٧٢- ئامادەكردنی پێشبڕكێی ڕاگەیاندنەوانی دەربارەی ژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)،وە كۆمەڵە خەلآتێكی بەنرخیشی بۆ تەرخان بكرێت .

٧٣- بڵاوكردنەوە و نوسینی چەند سەروتارو چیرۆك و نامیلكەیەك كە لەبارەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)بدوێن .

٧٤- پێشنیار بكرێت لەلای سەرنوسەری ڕۆژنامەو گۆڤارەكان بۆ تەرخان كردنی سوچێك لەڕۆژنامەو گۆڤارەكانیان بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو ئایەت وفەرموودانەی كەبەڵگەن لەسەر پێویست بوونی خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەهەروەها ئەوەش ڕوون بكرێتەوە كەخۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبێت لەپێش خۆشویستنی منداڵ ودایك وباوك وهەموو خەڵكیەوە دابنرێت، بەڵكو لەپێش نەفس وگیانی مرۆڤ خۆشیەوەتی، وە ئەم خۆشویستنەش ئەوەت لێ دەخوازێت كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە گەورە بزانیت وڕێزی بۆ دابنێیت وەشوێنی

بکەویت وە ووتەو قسەکانیشی بخەیتە پێش ووتەو قسەی هەموو کەسێکەوە لەدروست کراوەکان.

٧٥- پێشنیار بکرێت لەلای بەڕێوەبەرانی کەناڵە ئاسمانیەکان بۆ ئامادە کردنی چەندەها بەرنامەی تایبەتکراو بەژیان نامەو چۆنێتی مامەڵە کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ خێزان و منداڵ وهاوەڵان و دوژمنەکانیدا، وەجگە لەمانەش لەسیفەتە دیمەنی ورواڵەتی ورەوشتەکانی تریشی باس بکرێت .

٧٦- هانی دامەزرێنەران و دەزگاکانی وەبەرهێنەری ڕاگەیەندراوی بدرێت بۆ ئەوەی هەڵسن بەبەرهەمهێنانی چەند شریت و کاسێتێکی ڤیدۆیی کە ژیاننامە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیادا نمایش بکرێت بەشێوەیەکی کارامەو پیشەگەریانەو ئارەزوومەندانەوە .

٧٧- هانی ویستگەکانی تەلەفزیۆنی ناوخۆیی و کەناڵە ئاسمانیەکان بدرێت بۆ وەبەرهێنان و پەخش کردنی چەندفیلم کارتۆنێک بۆتازە پێگەیشتووان، کەباس لە




خووڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بكات، وەهەندێ چیرۆكی تریش كەلەسوننەت وفەرموودەكانی پێغەمبەری خـوادا(ﷺ) هاتوون و باس كراون.[*]

## سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی دامەزراوە خێرخوازی و بانگەواز خوازییەكان:

٧٨- دروست كردن وپێكهێنانی چەند لیژنەیەك یاخود چـەند بـەش ودەزگایـەك بـۆ ئـەوەی ئـەركی بـەرگری كـردن و سەرخستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگرنە ئەستۆ.

٧٩- تەرخان كردنی چەند شوێنێك لەپێشانگاكان و كـۆنگرە ناوخویی و نێو دەوڵەتیەكانی، كـەوا دامـەزراوەكان بەشـداری تێدا دەكەن، بۆنمایش كردنی ئەو پەرتوك و شـریت وكاسـێتە ڕەنگـی ودەنگیانـەی كەتایبـەت مەندیـەكانی پەیامەكـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیادا دەخەنە ڕوو .

---

* لەگەڵ بوونی هەندێك تێبینیشمان لەسەر ئەم خاڵە .

٨٠- تەرخان کردنی چەند جێگەیەکی هەمیشەیی بۆ بڵاو کردنەوەی شریت وکاسێت وپەرتووك و {المطويات} پێچ دراوەکان کەتایبەتبن بەباسکردنی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) .

٨١- تەرخان کردنی خەڵاتێکی بەنرخ وپێوراو کەلە پێشتردا ڕێکەوتبێتن لەسەری بۆ باشترین خزمەت کاری فەرموودەو ژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وە هەروەها ئامادەکردنی ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی ساڵانە بەوبۆنەیەوە کە بەتایبەت کەسایەتی‌یە گەورەکانی بۆ بانگ بکرێت .

٨٢- لەئەستۆ گرتنی بەچاپگەیاندنی ئەو پەرتووکانەی کە باس لە ژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکەن بەزمانە بیانیەکان وبێگانەکان وە هەروەهادابەشی بکەیت بەسەر سەنتەرەکانی ڕۆژ هەڵات ناسان وکتێبخانە گشتیەکان و زانکۆیی‌یەکانی هەموو جیهان.

٨٣- دەرکردنی گۆڤارێك یاخود پەخش نامەیەکی مانگانە، کە گرنگی وبایەخ بدات بەژیان نامە پاکەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و فێرکاریەکانی ئایینی ئیسلام، وەببێتە

هۆکـــارێکیش بۆناســـاندن وخـــستنە ڕووی خـــوو ڕەوشـــت و سـیفەتەکانی ئـەم ئوممەتـە و ڕەوشـتە بـەرزەکان وهـەموو لایەنە جوانـەکانی ئـەم ئایینـەپیرۆزەی کـە پێغەمبەرەکـەمان محمد (ﷺ)پێی هاتووە ٠

٨٤- تـــەرخان کردنـــی چـــەند ســـندوقێکی بەخـــشین بـــۆ دەوڵەمەنـد کـردن وپـشتیوانی کردنـی ئـەو هەڵمەتانـەی کـە دەدرێت بۆ سەرخـستنی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)وە هـەروەها ببێتەهۆکارێکیش بۆ کردنی ئەوکەسانەی کە دەیانەوێت شـت بنوســـن و وەربگێـــڕن دەربـــارەی ژیاننامـــەی پێغەمبـــەری خـوا(ﷺ) وە هـــەروەها پـشتیوانیەکیش بێـت بـۆ ئـەوەی بتوانرێت بەهۆی ئـەو یارمەتیانـەوە چـەند ماڵپـەڕێك دروسـت بکرێن لەسەر تۆڕە جیهانییەکان ٠

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئاستی فەرمانبەرانی تۆڕی جاڵ جاڵۆکەی {ئینتەرنێت}و خاوەن ماڵپەڕەکان:

٨٥- کۆمەڵەیەك پێك بهێندرێت بۆ سەرپەرشتیاری کردنی خستنە ڕووی هەموو لایەنە باشەکانی ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام ، وە هەروەها ڕوونیشی بکەنەوە کە تێڕوانینی ئیسلام و شوێنکەوتوانی بەرامبەر بە تێکڕای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام ) بەیەك شێوەو پلەیە لەدەربڕینی خۆشەویستی بۆیان وە جگە لەمەش لەو بابەتانەی تری کەپەیوەستن بەم باسەوە.

٨٦- کردنەوەی چەند ماڵپەڕێك یاخود چەندکۆڕو کۆڕبەندێك لەسەر ماڵپەڕەکان وەیاخود تەرخان کردنی چەند بەشێك لەو ماڵپەڕانەی کەئەمڕۆ هەن بۆ زیاتر گرنگی دان و بایەخ دان بە ژیان نامە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە هەروەها بۆ

ئەوەی پەیامە پیرۆزە جیهانی‌یەکەی زیاتر بۆ خەڵکی ڕوون ببێتەوەو ئاشکرابێت .

٨٧- بەشداری کردن لەگفتوگۆی بەسوود و لەسەرخۆ لەگەڵ ئەوانەی کە غەیرە موسوڵمانن،وە هەروەها بانگیان بکەیت بۆتاو توێ کردنی کەسایەتی پێغەمبەری خواو(ﷺ)ئەو ئایینە پیرۆزەی کە پێی هاتووە .

٨٨- دەستە بەرکردن و یاخود لەپەراوێز دانانی ئەونامە ئەلیکترۆنیانەی کە دەنێردرێت بۆ لیستە پۆستیەکان با تایبەت بێت بەهەندێ لەفەرموودەو ئامۆژگارییە پێغەمبەری‌یەکان (ﷺ).

٨٩- ئامادەکردنی پەخشێکی ئەلیکترۆنی لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەربارەی بانگەوازو کەسایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتایبەتی لەبۆنەکان و ڕووداوە کتوپڕەکانی کەلەناکاو دێنە ئاراوە بەویستی خوا.

٩٠- ڕیكلام كردن وجاڕدان لەوەگەڕهێنەرە بەناوبانگەكانی توێژینەوە سەبارەت بە هەندێك لەو پەرتوك و ووتارانەی كەباس لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەكەن.

# سەرخستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئاستی دەوڵەمەندان وسەرمایەداران ودەسەڵات دارە موسڵمانەكان:

٩١- پشت گیری كردنی ئەو چالاكی یە بانگخوازییانەی كە پەیوەستن بەژیان نامە شكۆدارەكەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ).

٩٢- چاپ كردنی { الملصقات} ئەو پۆستەرو هەڵواسراوانەی كەهەندێك لەفەرموودەكان و ئامۆژگاریە پێغەمبەرییەكانی(ﷺ) لەخۆ گرتووە .

٩٣–هاوكاری و بەشداری بكەیت لە دانان و كردنەوەی كەناڵی ئاسمانی و ئێزگە و ئەو گۆڤارانەی كە باس لە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام دەكەن (ﷺ) بەچەندەها زمانی جۆراوجۆر بەتایبەتی و لەسەروی هەمووشیانەوە زمانی ئینگلیزی .

٩٤– بەكرێ گرتنی چەند خولەكێك لەكەناڵ و ئێزگە بیانی-یەكان بۆ نمایش كردن وخستنە ڕووی توێژینەوە زانستیەكان و زانست ووتارەكانی كە سەبارەت بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) كراون و نوسراون ودراون .

٩٥– دروست كردن وكردنەوەی چەندسەنتەرێكی تایبەت كراو بەلێكۆڵینەوەو تاوتوێكردنی ژیان نامەكەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە پاشانیش ئەو لێكۆڵینەوانە وەربگێڕدرێتە سەر زمانە جیهانی‌یەكان.

٩٦– دروست كردن وكردنەوەی چەند مۆزەخانەو كتێبخانەیەكی تایبەت كراو بەژیان نامەو كەلەپورە شكۆدارو مەزنەكەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

٩٧- دروست کردن وکردنەوەی چەند ماڵپەڕێك لەسەرتۆڕی ئینتەرنێت کە تایبەت بکرێت بەژیاننامەو فەرموودە شکۆدارەکانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) .

٩٨- چاپ کردن وبلاّو کردنەوەی ئەو پەرتووك و کاسێت وبەرنامە ڕاگەیاندنیانەی کەباشی وجوانیەکانی ئەم ئایینە دەخاتە ڕوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی هاتووە لەگەڵ دەرخستن و خستنە ڕووی لایەنی ڕوواڵەت و شێواز و ڕەووشتە بەرزەکانی پێغەمبەری ئەم ئوممەتە(ﷺ) بەچەندەها زمان، بەتایبەتیش زمانی ئینگلیزی.

٩٩- بەشداری بکەیت لەپشتگیری کردنی ئەو پێش برکێ بانگەواز خوازییانەی کە گرنگی وبایەخ دەدەن بەژیان نامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە هەروەها بڕە پارەیەکیشی بۆ تەرخان بکرێت وەك هاندان وپشتگیری کردنێك بۆیان لەسەر ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەن .

ژمارەی ١٠٠بۆتۆی جێ دەهێڵین بۆ ئەوەی تەواوی بکەیت و بۆمانی بنێریت لەسەر ناونیشانی لیژنەکە [*].

کەواتە لەکۆتاییدا بۆمان دەرکەوت ئەی برای موسڵمانم و خوشکی موسڵمانم ....ئەوەی کە زۆر پێویستە لەسەر هەمووان کەجێ بەجێی بکەین – هەرکەس بەگوێرەی توانای خۆی– کە هەڵسین بە سەرخستنی پێغەمبەرو پێشەواو خۆشەویستمان موحەممەد(ﷺ)، ئا لەبەر ئەمەبوو کە ئەم یاداشت نامە و یادکەرەوەیەمان ئامادە کردبۆتان تاکو هیچ کەسێك لەئێمە بەهانەو بیانوی نەمێنێت لەلای خوای گەورە، دەی باهەموومان پێکەوە کار بکەین بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکردنی ئەم نامیلکەیە، وە هەروەها بانگەوازی خاو خێزان و سەرجەم خەڵکی بکەین لەمیانەی دانیشتنە

---

* هەرکەسێك لەسەر خاڵی کۆتای و (١٠٠)ەم بیروڕاو بۆچوونێکی باشی لایە بابۆنانیشانی ماڵپەڕەکەی بنێرێت بەڵام بەمەرجێك بەزمانی (عەرەبی ) بێت / تێبینی: ئەم ماڵپەرە ماڵپەرێکی زۆر پەیوەست بوو نیە بەڕێنمایە چاکەکانی ئاینی پیرۆزەوە بەڵام ئەم بابەتەیان جیاواز لەبابەتەکانی تریان کەبڵاویان کردۆتەوە بابەتێکی تارادەیەك باشە.والله أعلم.

خێزانیەکان و گفتوگۆ تەلەفۆنیەکان و نامە مۆبایلیەکان بۆ سەر خستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) .

ناونیشانی ماڵپەڕو ستانیك www.icsfp.com

پۆستی ئەلیکترۆنی Info@icsfp.com

تەواوبووم لەوەرگێڕانی ئەم نامیلکەبەسودە لە ڕۆژی

چوارشەمە

ربیع الاول بەرواری/١٤٢٨/٣/٢٣ ھ

بەرامبەر /٢٠٠٧/٤/١١ مـ

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# ناوەڕۆك

- قال الإمام أحمد بن حنبل رحمه الله :

* من شتم الرسول ﷺ ، أو انتقصه مسلما كان أو كافرا فعليه القتل ، وأرى أن يقتل ولا يستتاب .

- قال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله :

* ان سب الله أو سب رسوله كفر ظاهرا وباطنا ، سواء كان الساب يعتقد أن ذلك محرم أو كان مستحلا ، أو كان ذاهلا في اعتقاده .

- قال الإمام أبو بكر بن المنذ ر رحمه الله :

* أجمع عوام أهل العلم على أن حد من سب النبي ﷺ القتل ، وهو مذهب الشافعي رحمه الله .

- قال العلماء في اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء :

* سب الله ورسوله وسب الدين كفر أكبر وردة عن الإسلام ، فيستتاب فإن تاب قائلها وإلا وجب على ولى الأمر قتله ، لقول النبي ﷺ من بدل دينه فاقتلوه ، رواه البخاري .